زنجیرەی فەرموودە ڕاستەکان

(٦)




# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

## لە صەحیحی سونەنی نەسائی


ئامادە کردنی:

أنـور قـادر شـێخانی





چاپی یەکەم

هەولێر

١٤٢٠ك - ١٩٩٩ز

زنجیرەی فەرموودە راستەکان
( ٦ )



# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ
## لە صەحیحی سوننەنی نەسائی

ئامادە کردنی
أنور قادر شێخانی

هەولێر
چاپی یەکەم
١٤٢٠ك-١٩٩٩ز

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:-

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد إمام المتقين وقائد الغر المحجلين وعلى آله وصحبه أجمعين وبعد..

خوشك برایانی بەڕێز: ئەم نامیلکەیەی لەبەردەستتان دایە بریتی‌یەلە (١٠٠) فەرموودەی پێغەمبەر لە گێڕانەوەی ئیمامی نەسائی لە سونەنەکەیدا. وبریتی‌یە لە زنجیرەی شەشەم لە زنجیرەی فەرموودە راستەکان (الأحاديث الصحيحة).

وە هەموو فەرموودەکان (صەحیحن) و لەگەڵ (صحيح السنن النسائي)ی شێخ البانی بەراورد کراون وە دەقی فەرموودەکان نووسراون وە لە دوای هەر فەرموودەیەك ژمارەی بەرگو ژمارەی لاپەڕە هاتووە لە کتێبی (سنن النسائی)ی (الحافظ جلال الدين السيوطي وبحاشية الإمام السندي).

وە لە دوایی‌دا لە خوا دەپاڕێمەوە کەبمانخاتە ژێر سێبەری رەحمەتی خۆی‌و ئیخلاص لە کردەوەمان بەدی بهێنێ آمین

**أنور قادر شێخانی**
**١٩٩٩/٦/١٧ز**
**هەولێر**

١) ((إذا استيقظ احدكم من نومِهِ فلا يغمس يـده في وضوئِهِ حتى يَغسِلَها ثلاثاً فإنَّ احَدَكُمْ لا يَدْري اينَ باتَت يَدَهُ)) ١/٧.

کاتێ لەخـەو هەڵدەستن دەستتان مەخەنـە ناوئەوشتانەی ئاوی دەستنوێژی تیایە تا لە دەرەوەیدا سێ جاران دەستتان دەشۆن چونکە نازانن دەستتان شەو لـەکوێ بووە یان چی پێوەدا ڕۆییوە.

٢) ((مَنْ لَمْ يَاخُذْ مِنْ شاربِهِ فَلَيسَ مِنّا)) ١/١٥.

کەسێ بەرسمێڵی خۆی نـەکات لەئێمـە نییـە، واتـە/ نـابێت موەکانی سمێڵی ئـەوەندە درێـژ بێـت، بکەوێتـە نـاو دەمــی و لێوەکانی بزر بکات.

٣) ((أحفُوا الشَوارِبَ وأعفُوا اللّحى)) ١/١٦.

سمێڵتان کورت بکەنەوەو ریشتان بهێڵنەوە.

٤) ((عَنْ ابي هُرَيرَة قالَ قامَ اعرابيٌ فَبـالَ في المسْجِدِ فَتناوَلَهُ النّاسُ فقالَ لَهُمْ رَسولُ اللهِ ﷺ دَعوهُ واهرِيقوا على بَوْلِهِ دَلْواً مِـنْ ماءٍ، فإنّما بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ ولَمْ تُبعَثوا مُعَسِّرينَ)) ١/٤٨.

ئـەبو هورەیـرە دەفـەرمووێ عـەرەبێکی دەشـتەکی هەڵسـا لەناو مزگەوتا میزی کرد، چەند کەسێ تێیان خوڕی، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی وازی لێ بێنن بەڵکو سەتڵێ ئاو یان دۆڵچەیێ ئـاو

بێنن بە شوێنی میزەکەیدا بکەن، ئێوە رەوانـە کراون بۆ سـەر مەردوما کە ئیشو کار ئاسان بکەن نەك کار گرانو قورس بکەن.

٥) ((إذا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِها الأربَعِ ثُمَّ اجْتَهَدَ فَقَدْ وَجَبَ الغُسْلُ)) ١/١١١.

کە پیاو لە نێوان چوارپەلی ئافرەتی خۆی دانیشتو لەگەڵیا جووت بوو وخۆی ماندوو کرد ئیتر خۆشۆردن لەسەر هەردوولایان پێویست دەبێ.

٦) ((عَنْ إبنِ عبّاس أنَّ النَّبِيَّ ﷺ شَرِبَ لَبَناً ثُمَّ دعا بِماءٍ فَتَمَضْمَضَ ثُمَّ قالَ إنَّ لهُ دَسَماً)) ١/١٠٩.

ئیبن عەبباس دەفەرمووێت پێغەمبەری خـوا ﷺ شـیری خواردو دوایی داوای ئاوی کـردو لە دەمـی راداو فەرمووی شیر چەوری تیایە.

٧) ((إنَّ العهْدَ الذي بَيْنَنا وبَيْنَهُمْ الصَّلاةُ فَمَنْ تَرَكَها فقَدْ كَفَرَ)) ١/٢٣٢.

پەیمانی نێوان ئێمەو خوانەناسان نوێژەو کەسێ نوێژی نەکرد بێ بڕوایە.

٨) ((أوّلُ ما يُحاسَبُ بِهِ العَبْدُ صَلاتُهُ فإنْ أكمَلَها وإلاّ قالَ الله

ﷻ انظُروا لِعَبْدي مِنْ تطَوّعٍ فإنْ وَجَدَ لَهُ تطَـوّعٌ قـالَ أكمِلـوا بِـهِ الفَريضَةَ)) ١/٢٣٢.

يەكەم شتێ کە موحاسەبەی لەسەر بەندەی پێ دەکرێ لە رۆژی دوایی نوێژە، جا ئەگەر بەتەواوی ئەنجامی دابوو باشە، ئەگینا خوای گەورە دەفەرمووێ تەماشای سوننەتەکانی بکەن ئەگەر نوێژی سوننەتی هەبووبێ ئەوا دەفەرمووێ لەوانە بۆی تەواو بکەن.

٩) ((عَنْ أنَسٍ قالَ سُئلَ رَسول اللهِ ﷺ عنْ الرّجُلِ يَرْقُـدُ عَـنِ الصَّلاةِ أوْ يَغْفُلُ عَنها قالَ كَفارَتُها أنْ يُصَلّيها إذا ذَكَرَها)) ١/٢٩٤.

ئەنەس دەفـەرمووێ پرسـيار لـە پێغەمبـەری خـوا کـرا دەربارەی کەسێ کە خەوی لێ کەوت یان بەکاری ترەوە خەریك بوو نوێژی لەسەر چوو کەفارەتی ئەو نوێژە کردنیەتی لەو کاتەی کە بە بیری هاتەوە یان بە خەبەر هات.

١٠) ((يَعْجبُ رَبُّكَ مِنْ راعيَ غَنَمٍ في رأسِ شَظيّةِ الجَبَلِ يُؤَذِّنُ بالصَلاةِ وَيُصَلّي فَيَقولُ اللهُ ﷻ انظُروا الى عَبْدي هَذا يُـؤَذِّنُ وَيُقيـمُ الصَّلاةَ يَخافُ مِنّي قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدي وادخَلْتُهُ الجَنّةَ)) ٢/٢٠.

خوای گەورە تەعەجوب دەکات لە شوانێ کە رانە مەڕێکی پێیەو لە لەد پالی کێوێ بانگ دەداتو قامەتو نوێژ دەکات، خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرمووێ تەماشای بەندەم بکەن

بانگ دەدات و نوێژ دەکات و لێم دەترسێ وا منیش لێی خۆش بووم و دەی خەمە بەهەشتەوە.

١١) ((حِينَ يَخْرُجُ الرَجُلَ مِنْ بَيْتِهِ الى المَسْجِدِ فَرِجْلٌ تَكْتُبُ حَسَنَةً وَرِجْلٌ تَمْحوا السَيِّئَةَ)) ٢/٤٢.

کەسێ کە دەچێتە دەرەوە لە ماڵەوە بۆ مزگەوت بەهەر هەنگاوێکی خێرێکی بۆ دەنووسرێ و گوناهێکی لەسەر رەش دەبێتەوە.

١٢) ((إذا دَخَلَ احَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ انْ يَجْلِسَ)) ٢/٥٣.

هەرکاتێ کەسێ لە ئێوە چووە ناو مزگەوت لە پێش دانیشتن دا دوو رەکعات نوێژی سوننەت بکات (سوننەتی چوونە ناو مزگەوت).

١٣) ((إذا كانوا ثلاثةً فَلْيَؤُمُّهُمْ احَدُهُمْ واحَقُّهُمْ بالإمامةِ اقرؤُهُمْ)) ٢/١٠٤.

کە (٣) کەس بوون با یەکێکتان بەر نوێژەکە بۆ ئەوانی تر بکات و ئەوەیان کە زۆر شارەزایە لە قورئاندا با ئەو بەرنوێژەکە بکات.

١٤) ((عَنْ ابي هُرَيرَةَ قالَ امَرَ رَسولُ اللهِ بِقَتْلِ الأسْوَدَيْنِ فِي

الصّلاةِ)) ٣/١٠.

ئەبو هورەیـرە دەفـەرمووێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی دەکرد بە کوشتنی مارو دوپشك هەتا لە ناو نوێژیشدا بن.

١٥) ((زَيّنوا القُرآنَ بِأصْواتِكُمْ)) ٢/١٨٠.

قورئان برازێننەوە بە دەنگە خۆشەکانتان.

١٦) ((مَنْ صَلّى أرْبَعُ رَكْعاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وأرْبَعاً بَعْدَهـا حَرَّمَـهُ اللهُ ﷻ على النّار)) ٢/٢٦٥.

کەسێ چـوار رەکعـات نوێـژی سوننەت لــە پێــش نوێـژی نیـوەڕۆو چـواری تـر لـەدوایی دا بکــات خــوای گــەورە ئــاگری دۆزەخی لەسەر حەرام دەکات.

١٧) ((إذا زارَ أحَدَكُمْ قَوْماً فلا يُصَلّيَنَّ بِهِمْ)) ٢/٨٠.

کەسێ سەردانی خەڵکی کـرد بـا بەرنوێژەکـەیان بـۆ نـەکات مەگەر ئەوان ئیزنی بدەن.

١٨) ((إذا أقِيمَتْ الصَّلاةُ فلا صلاةَ إلا المَكتوبةَ)) ٢/٢٠٩.

کاتێ قامـەتی‌نوێژ کردن هـات تەنـها نوێـژی فـەرز دروسـتە بکرێت.

١٩) ((رَواحُ الجُمُعَةِ واجبٌ على كُلّ مُحْتَلِمٍ)) ٢/٨٩.

چوون بۆ نوێژی هەیتی لەسەر هەموو موسڵمانی نێرینەی بالق بوو فەرزە.

٢٠) ((إذا حَضَرتُمْ المَريض فقولوا خيّراً فإنْ المَلائِكة يؤمّنون على ما تقولون)) ٤/٤.

کە حازری سەر نەخۆشی کیانەلا دەبن دوعای خێرو باشەیان بۆ بکەن چونکە فریشتەکانی خوا هەرچی ئێوە بیلێن ئەوان ئامینی لەسەر دەکەن.

٢١) ((لا يَتَمَنّيَنَ احَدَكُمُ المَوْتَ لِضُرّ نَزَل بِهِ في الدّنيا وَلَكِنَ لِيَقُلْ اللّهم احيني ماكانتِ الحياةُ خيْراً لي وتوَفّني إذا كانتِ الوَفاةُ خيَراً لي)) ٤/ ٣.

ئەگەر یەکێکتان دووچاری زیانێ بوو با مردن بەئاوات نەخوازێ ئەگەر هەر نەدەی بۆ هێنا با بڵێ خوایە هەتاژیانم باشترە لەمردن بم ژێنە وەئەگەر مردنیش باشتر بوو بۆم بم مرێنە.

٢٢) ((المُؤمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الجَبين)) ٦/ ٤.

ئیماندار کاتێ دەمرێ نێوچاوانی ئارەقەی دەکات.

٢٣) ((مَنْ احَبَّ لِقاءَ الله احَبَّ اللهُ لِقاءَ هُ وَمَنْ كَرِهَ لِقاءَ اللهِ كَرِهَ اللهُ لِقاءَ هُ)) ٤/١٠.

کەسێ حەز بکات بە دیداری خوا شاد بێت خواش حەز بە

ئیداری ئەو دەکات وەکەسێ حەزیە ئیداری خوانەکات خواش حەز بە ئیداری ئەو ناکات.

٢٤) ((ما مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَفَّى لَهُ ثلاثةٌ مِنَ الوَلَدِ لَمْ يَبْلُغوا الحِنْثَ إلاّ ادخلَهُ اللهُ الجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إيّاهمْ)) جزوء٤/ص٢٤.

هەر موسڵمانێ سێ منالی بچووکی نەبالقی بمرن و ئارامی لەسەر بگرێ بێ گومان خوای گەورە بۆ خاتری سۆزی ئەو منداڵانە دەیباتە بەهەشتەوە.

٢٥) ((إذا وضِعَتْ الجَنازةُ فاحتَمَلَها الرِّجالُ على أعناقِهِمْ، فإنْ كانَتْ صالِحةً قالَتْ قَدِّموني قَدِّموني وإنْ كانَتْ غَيرَ صالِحةٍ قالَتْ يا وَيْلَها الى أيْنَ تَذهَبونَ بِها يَسْمَعُ صَوتَها كُلّ شيءٍ إلاّ الإنسانَ ولوْ سَمِعَها الإنسانُ لَصُعِقَ)) ٤١/٤.

کاتێ پیاوان تەرمی مردوو دەخەنە سەرشانیان بۆ گۆڕستانی دەبەن لەوکاتەدا ئەگەر مردووەکە چاکە کاربێت دەڵێ زووکەن زووکەن بمبەن بەلاَم ئەگەر مردووەکە خراپەکار بێت دەڵێ هەی هاوار بۆ کوێم دەبەن پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ لەم کاتەدا هەموو شتێ ئەم دەنگە دەبیسێ تەنها ئادەمی نەبێت و ئەگەرگوێی لێ ببا لەم هاوارە لە ترسان دەتۆقی.

٢٦) ((عَن عائشةَ رضي اللهُ عنها قالَتْ ذُكِـرَ عِنـدَ النبيِّ ﷺ هالِكٌ بِسوءٍ فقالَ لا تذكُروا هَلكاكُمْ إلاّ بخيرٍ)) ٤/٥٢.

عائيشه خان دەفەرمووێ لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی مردوویەك بە خراپە كرا ئەویش فەرمووی بـە چاكە نـەبێ باسی مردووی خۆتان مەكەن.

٢٧) ((صُوموا لِرُؤيَتِهِ وافطِروا لِرُؤيَتِهِ فإنْ غُمَّ عَلَيكُمُ الشَّـهرَ فَعُدّوا ثلاثينَ)) ٤/١٣٥.

كە مانگتان دیت بیكـەن بـە رەمـەزانو بـەرۆژوو بن وە كـە مانگتان دیت بیكەن بە جەژن وە ئەگەر ئاسمان هەورو تەمو مـژ بوو مانگتان بۆ نەدەدیترا ئەوا (٣٠) رۆژی تەواو بژمێرنو بیكـەن بە رەمەزان.

٢٨) ((إنَّ فَصْـلُ مـابَينَ صِيامِنـا وَصِيـامُ اهـلِ الكتـابِ اكلَـةُ السحور)) ٤/١٤٦.

جیـاوازی نێوان رۆژی ئێمــەو رۆژووی گـاورو جولەكـەكان خواردنی پارشێوە.

٢٩) ((ماحِقّ امرِيءٍ مُسْلِمٍ لَهُ شيءٌ يوصـي فيـهِ يَبيـتُ لَيلَتَـينِ وَوَصيَّتُهُ مَكتوبَةٌ عِندَهُ)) ٦/٢٣٩.

هـەر موسڵمانێ شتێكی هـەبێ لـە مـاڵو سـامان بیـەوێ

وەسیەتی بۆ بکا حەق وایە دوو شەوی بەسەرا تێنەپەڕێ هەتا وەسیەتەکەی بە نووسراوی لە لای خۆی دادەنێ.

٣٠) ((ما يَزالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ حتّى يأتيَ يومَ القيامةِ وَلَيْسَ في وَجْهِهِ مِزْعَةُ لَحْمٍ)) ٥/٩٤.

پیاوی وا هەیە هەر سواڵو دەرۆزە دەکات لە خەڵکی هەتا دەکاتە ڕۆژی قیامەتو دەمو چاوی هەڵکەندراوە هیچ گۆشتی پێوە نەماوە تەنها ئێسقان نەبێت.

٣١) (( ما مِن رَجُلٍ لَهُ مالٌ لا يؤدي حقّ اللهِ إلاّ جَعَلَ لَهُ طَوقاً في عُنُقِهِ شُجاعَ الأقرَعِ وهُوَ يَفِرُّ مِنهُ وهوَ يَتبَعُهُ ثُمَّ قرَأَ مِصداقَهُ في كِتابِ اللهِ ﷻ ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ الآية)) ٥/١١.

هەر کەسێ خوا ماڵو سامانی پێ بەخشیو ماڵی خەڵکی هەژاران کە زەکاتە نەیدا ئەوا ماڵەکەی دەبێتە مارێکی کەچەڵی ژەهردار پێوەی دەداتو ئەویش لە بەری رادەکات وەمارەکەش بەدوای دەکەوێت لە ڕۆژەخداو لە ملی لوول دەخواو لە پاشان پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ

مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ الآية.

٣١) ((عَنْ إبن عبّاس انَّ رسولُ اللهِ ﷺ قامَ فقالَ إنَّ اللهَ تعالى كُتِبَ عَلَيْكُمُ الحَجّ فقالَ الأقرَعُ بنُ حابِسْ التَميمي أكُلَّ عامٍ يا رَسولُ اللهِ ﷺ فَسكَتَ فقالَ لَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوجَبَتْ ثُمَّ إذاً لا تَسْمَعونَ ولا تُطِيعونَ ولكِنَهُ حَجَّةٌ واحدةٌ)) ٥/١١١.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا ﷺ ووتاری دەدا فەرمووی خوای گەورە حەجی ماڵی خۆی لەسەر ئێوە پێویست کردووە، ئەقرەعی کوڕی حابس فەرمووی: هەموو ساڵێ و ئەویش کەمێ بێ دەنگ بوو دوایی فەرمووی ئەگەر ووتبام بەڵێ ئەوا لەسەرتان پێویست دەبوو و نەتاندەتوانی ئەنجامی بدەن بەڵکو لە عومرا یەك جار حەج کردن.

٣٢) ((جِهادَ الكَبِيرِ والصَغيرِ والضَعيفِ والمرأة، الحجُّ والعُمْرَةَ)) ٥/١١٤

جیهادو تێکۆشانی پیران و بچووکان و بێ هێزان و ژنان حەج و عومرە کردنە.

٣٣) ((عَنْ عبدالله بنُ عُمَر قالَ جاءَ رَجُلٌ الى رَسولِ اللهِ ﷺ يَستَأذِنُهُ في الجِهادِ فقالَ أحَيٌّ والداكَ قالَ نَعَمْ قالَ فَفيهِما فَجاهِدْ)) ٥/١٠.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەفەرمووێ: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئیزنی چوونە جیهادی کرد، ئەویش فەرمووی ئایا دایکتو باوکت لە ژیاندا ماوون، ئەویش ووتی بەڵێ فەرمووی بڕۆ دڵی ئەوان راگرەو خزمەتیان بکە، بۆ تۆ وەکو جیهادە.

٣٤) ((مَنْ جَهَّزَ غازياً في سبيلِ اللهِ فقدْ غزا وَمَنْ خَلَفَهُ في أهْلِهِ بِخَيْرٍ فقدْ غزا)) ٤٦/٦.

هەر کەسێ موجاهیدێك بەڕێ بکاتو پێویستی جەنگی بۆ دابین بکات، ئەوا ئەجرو پاداشتی غەزای بۆ دەنووسرێ وە کەسێ چاوی لەماڵو منداڵی موجاهیدێك بێتو دەست بەسەریان دابهێنێ بەچاکە ئەوا بەقەد موجاهیدەکە پاداشت وەردەگرێ لەلای خوا.

٣٥) ((ثلاثةٌ حقٌ على اللهِ ﷻ عَونُهُمْ المَكاتِبُ الذي يُريدُ الأداءَ والنَّاكِحُ الذي يُريدُ العَفافَ والمُجاهِدُ في سبيلِ اللهِ)) ٦١/٦.

سێ چین هەن حەقە لەسەر خوای گەورە یارمەتیان بدات: بەندەیەکە دەیەوێ پارە پەیدا بکاتو خۆی پێ ئازاد بکات، وە گەنجێکە دەیەوێ ژن بهێنێ بۆ ئەوەی دوور کەوێتەوە لە داوێن پیسی، وە موجاهیدێکە لە پێناوی خوا جیهاد دەکات.

٣٦) ((عِصابَتان مِنْ أمّتي أحرَزَهُماَ اللهُ مِنَ النّار، عِصابَةٌ تَغْـزو الهِندَ وعصابَةٌ تكونُ معَ عيسى بنُ مَرْيَمَ عَلَيهِما السّ ٦/٤٣.

دوو كۆمەڵ لە ئوممەتی من [illegible] ئاگر [illegible] نایانگرێ ئەوانیش: كۆمەڵێكن لە موسـڵمانان كـە جیهادی ناوچـەی هینـد ئەكـەن و كۆمـەڵێكی تریش ئەوانـەی لـە ئـاخری زمانــا لەگـەڵ عیسای كوڕی مەریەم جیهادو تێكۆشان دەكەن لە پێناو خوادا.

٣٧) ((رباطُ يَومٍ في سبيلِ اللهِ خَيْرٌ منْ ألفِ يَومٍ فِيما سواهُ منَ المنازلِ)) ٦/٤١.

ئێشككری ڕۆژێ لە مەیدانی جیـهاد دا لـە پێنـاوی خـودا لـە لای خـوا چاكـترە لـە هـەزار ڕۆژ لـە ماڵـەوە كەئـەم ڕۆژەی تێـدا نەبێ.

٣٨) ((عنْ عبدُاللهِ بنُ عَمْرو أن رَجُلاً أتى النّبيَ ﷺ فقالَ: إني جئتُ أبايعكَ على الهِجْرَةِ وَلَقَدْ تَرَكْتُ أبَـوَيَّ يَبْكيـانِ فقالَ إرجَـع إليهِما فَاضحِكْهُما كما أبْكَيْتَهُما)) ٧/١٤٣.

عـەبدوڵلای كـوڕی عومــەر دەفــەرموێ پیــاوێ هاتــە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی هـاتووم پـەیمانت دەدەمـێ بـۆ هیجرەت كردن بۆ خوا وە دایكو باوكم بەجێ هێشت بە گریانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بڕۆرەوە بۆ لایان دڵیان خۆش كـە چۆن گریان ئاوا كەیف خۆشیان بكە.

٣٩) ((عَنْ عَبْد اللهِ بنُ حَبَشْ الخثعمي أنَّ النَّبيّ ﷺ سُئِلَ أيُّ الأعمال أفضَل؟ فقالَ إيمانٌ باللهِ لا شكٌّ فيهِ وجهادٌ لا غُلولَ فيهِ وحَجةٌ مَبْرورة)) ٨/٩٤.

عەبدوڵڵای کوڕی حەبەش دەفەرمووێ پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا چ کردەوەیەك لە هەموویان گەورەترە لە لای خوا. فەرمووی: باوەڕ هێنان بە خوا بە بێ گومانو دوودڵی، وجیهاد کردن بەبێ دزینی تالان وە حەجی ماڵی خوا کردن بە تەواوی.

٤٠) ((خِيارُكُمْ احْسَنُكُمْ قَضاءً)) ٧/١٣.

چاکترینتان ئەو کەسەیە کەجوانترین دادوەر بێت.

٤١) ((إنَّكُمْ سَتُحرَمونَ على الإمارةِ وإنَّها سَتَكونُ نَدامةً وَحَسْرَةً فَنِعْمَتِ المُرضِعَةُ وَبِئْسَتِ الفاطِمَةُ)) ٧/١٩٢.

ئێوە سوورن لەسەر بوون بە فەرمانڕەوایی‌و سەروەری خەڵکی، بەڵام پەشیمانی لە دوایە بەڵێ لە دونیادا دایەنی چاکە بەڵام لە شیربڕینەوەکەی خراپە، واتە چارەنووسی ڕۆژی دوایی کەلێ خراپ‌و ناخۆشە.

٤٢) ((مَنْ وَلِيَ مِنكُمْ عَمَلاً فارادَ اللهُ بِهِ خَيْراً جَعَلَ لَهُ وَزيراً صالِحاً إنْ نَسيَ ذَكَّرَهُ وإنْ ذكرَ اعانَهُ)) ٧/١٥٩.

کەسێ لە ئێوە کرا بە پێشەواو سەرداری خەڵکی وە خوا گومانی باشی پێ بوو ئەوا وەزیرێکی یان هاوەڵێکی باشی بۆ پەیدا دەکات کە ئەگەر شتێکی لە بیر چوو ئەوە بە بیری دێنێتەوە وە ئەگەر لە بیری بوو ئەوا یارمەتی دەدات بۆ ئەنجام دانی.

٤٣) ((أربَعَةٌ يَبغَضُهُمُ اللهُ ﷻ: البَيّاعُ الحَلّافُ والفَقيرُ المــختالُ والشَيخُ الزاني والإمامُ الجائرُ)) ٥/٨٦.

چوار چین هەن خوای گەورە رقی لێیانە: ئەوانیش فرۆشیاری سوێند خۆر، وە هەژاری لووت بەرزو بەفیز، وە پیری داوێن پیس، وە پێشەوای ستەمکار.

٤٤) ((حَدٌّ يُعمَلُ في الأرضِ خيرٌ لأهل الأرضِ مـن أن يمطِـروا ثلاثينَ صباحاً)) ٨/٧٦.

حەددی شەرعی لەسەر زەوی ئەنجام بدرێ بۆ خەڵکی سەر زەوی باشترە لە باران بارینی (٣٠) رۆژان لەسەر یەك بۆ زەوی و خەڵکی زەوی.

٤٥) ((عنْ عبدالله قالَ خَرَجنا معَ رسولُ اللهِ ﷺ وَنَحنُ شبابٌ لا نَقدِرُ على شيءٍ قالَ يا مَعْشَرَ الشبابِ عَلَيْكُمْ بالباءة فإنّهُ اغــضُّ للبَصرِ واحصنُ للفَرْجِ وَمَــنْ لَـمْ يَسْـتَطِعْ فَعَليـهِ بـالصَّومِ فإنّـهُ لَـهُ

وجاءٌ)) ٦/٥٨.

عەبدوڵڵا دەفەرمووێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ڕۆیشتین‌و گەنج بووین توانای ژن هێنانمان نەبوو و فەرمووی ﷺ ئەی گەلی گەنجان ژن بخوازن چونکە بەهۆی ئەوەوە داوێنتان پاك‌و چاوتان پارێزراو دەبێت وەکەسێ توانای ژن هێنانی نەبوو با بەڕۆژوو بێ چونکە دەبێتە هۆی پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە.

٤٦) ((إنَّ العَبْدَ إذا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلّى عَنْهُ اصْحابُهُ إنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعالِهِمْ قالَ فَيَأتيهِ مَلَكان فَيُقْعِدانِهِ فَيَقولان لَهُ ما كُنْتَ تَقُولُ فِي هذا الرَّجُل، فامّا المُؤْمِنُ فَيَقولُ اشْهَدُ انَّهُ عَبْدُ اللهِ وَرَسولِهِ فَيُقالُ لَهُ انْظُرْ الى مَقْعَدِكَ مِنَ النّارِ قَدْ أبْدَلَكَ اللهُ بِهِ مَقْعَداً مِنَ الجَنَّةِ، قالَ النَّبيّ ﷺ فَيَراهُما جَميعاً)) ٤/٩٧.

بەندە کاتێ دەخرێتە ناو گۆڕەو خەڵکان بەجێی دێڵن‌و چرپەی پێڵاویان دەبڕێ لەو کاتەدا دوو فریشتە دێنە لای‌و پێی دەڵێن چی دەڵێی دەربارەی ئەم پیاوە (محمد) ﷺ، وە ئەگەر ئیماندار بێت دەڵێ شایەتی دەدەم کە بەندەو پێغەمبەری خوایە لەو کاتەدا فریشتەکان پێی دەڵێن تەماشا کە تۆ جێگات دۆزەخ بوو بەڵام خوای گەورە بۆی گۆڕی بە بەهەشت، پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ ﷺ هەردوو جێگای پێ نیشان دەدرێ.

٤٧) (( دَعْ ما يُريبُكَ الى ما لا يُريبُكَ)) ٨/٣٢٧.

واز لەم شتە بێنە کە شك و گومانت لێیە بۆ ئەو شتەی کە شك و گومانت لێی نییەو بیکە.

٤٨) ((حُبِّبَ اليَّ منَ الدُّنيا النِّساءُ والطِّيبُ وجُعِلَ قُرَّةُ عَيني في الصَّلاةِ)) ٦١/٧.

لە دونیادا ئەم دوو شتەم لەلا خۆشەویستر کراون: ئافرەت و بۆنی خۆش وە لە نوێژیشدا چاو ودڵم ڕۆشن دەبێتەوە.

٤٩) ((لا يَحِلُّ لإمرأةٍ تُؤمِنُ باللهِ واليَوْمِ الآخِرِ انْ تُحِدَّ على مَيِّتٍ فوقَ ثلاثٍ إلاَّ على زوجٍ ولا تَكتَحِلَ ولا تَختَضِب ولا تَلبِسُ ثوباً مَصبوغاً)) ٢٠٤/٦.

دروست نییە بۆ ئافرەتێ باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ کە لە سێ ڕۆژان زیاتر پرسەو ماتەمی دابگرێ بۆ مردوو تەنها بۆ مێردی نەبێت ئەویش نابێت چاو برێژێ بە کلّ و خەنە لەسەری بداو جلی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر بکات تاکو چوار مانگ و دە ڕۆژ.

٥٠) ((إنَّ الدُّنيا مَتاعٌ وخَيْرُ متاعِها المرأةُ الصَّالِحةُ)) ٦٩/٦

دونیا کاڵاو شتومەکەو چاکترین کاڵاو شت و مەکیش لە دونیادا ئافرەتی چاك و صالیحەیە.

٥١) ((أيُّما إمرأةٌ إستَعطَرَتْ فَمَرَّت على قَومٍ لِيَجِدوا مِنْ ريحها فهي زانيةٌ)) ١٥٣/٨

هەر ئافرەتێ خۆی بۆن خۆش بکاو بە لای کۆمەڵێ خەڵکیدا رابووردو بۆ ئەوەی بۆنی بکەن ئەوە وەکو زینای کردبێ وایە.

٥٢) ((كُلُّ مُسْكِرٍ حَرامٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ)) ٨/٢٩٧.

هەموو شتێ مەست کەر بێت حەرامەو قەدەغەیە وە هەموو مەستکەرێکیش ئارەقە (مەی)یە.

٥٣) ((لاَيَدْخُلُ الجَنَّةُ مَنَّانٌ ولا عاقٌ ولا مُدْمِنُ خَمْرٍ)) ٨/٣١٨.

ئەوەی منەت بەسەر خەڵکیدا بکاتو ئەوەی دڵی دایکو باوکی برەنجێنێ، وەئەوەی بەردەوام بێت لەسەر مەی خواردنەوە ناچنە بەهەشتەوە.

٥٤) ((شَرُّ الكَسْبِ مَهْرُ البَغِيِّ وثَمَنُ الكَلْبِ وَكَسْبُ الحجَّامِ)) ٧/١٩.

خراپترین کاسبی، کاسبی بە ئافرەتی داوێن پیس کردن، وەرگرتنی نرخی فرۆشتنی سەگو کاسبی بە کەڵەشاخ گرتنە.

٥٥) ((كلُّ ذي نابٍ مِنْ السِّباعِ فَأكْلُهُ حَرَامٌ)) ٧/٢٠.

هەر دوڕندەیەك کەڵبەی هەبێتو توانای هێزی شکاندنی نێچیری هەبێت خواردنی گۆشتی ئەم دوڕندەیە حەرامە.

٥٦) ((لَعَنَ اللهُ مَنْ مَثَّلَ بالحَيْوانِ)) ٧/٢٢٨.

نەفرینی خوا لەو کەسەی کە گوێ یان لووت یان هەر لاشەیی گیاندار دەبڕێ بە زیندوویی.

٥٧) ((لا تتخذوا شيئاً فيه الرُّوحُ غرَضاً)) ٧/٢٣٨.
نابێت گیانداری بکرێتە نیشانەو چەکی تێ بگیرێ.

٥٨) ((إنّي كُنتُ نهيتُكُمْ عنْ لُحومِ الأضاحي فتزوّدوا وادّخِروا وَمَنْ أرادَ زيارةِ القُبور فإنّها تذكّرُ الآخِرةَ واشرِبوا واتّقوا كلَّ مُسكِرٍ)) ٤/٨٩.
من نەهیم کردبوو لە خواردنی گۆشتی قوربانی بەڵام لە ئێستا بەو لاوە بیخۆن و هەڵی بگرن و کەسێ ویستی سەردانی گۆرستان بکات با بچێ چونکە ڕۆژی دوایی‌تان بە بیر دێنێتەوە هەموو خواردنەوەیەکیش بخۆنەوە تەنها هی مەستکەر نەبێت خۆتانی لێ بپارێزن.

٥٩) ((عنْ علي بن أبي طالب قالَ إنَّ رسولَ اللهِ ﷺ أخذَ حَريراً فجعَلَهُ في يَمينِهِ وأخذَ ذهَباً فجعَلَهُ في شِمالِهِ ثمَّ قالَ إنَّ هذينِ حَرامٌ على ذُكورِ أمّتي)) ٨/١٦٠.
عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوریشمی بە دەستی ڕاستەوە گرت و ئاڵتونیشی بە دەستی چەپەوە گرت و فەرمووی ئەوانە قەدەغەن لەسەر نێرینەی

ئوممەتی من.

٦٠) ((بينا رَجلٌ يَجُرُ إزارَهُ مِنَ الخَيَلاءِ خُسِفَ بِهِ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ في الأرْضِ الى يَومِ القِيامَةِ)) ٨/٢٠٦.

پیاوێ لەئومەتەکانی پێشوو بە دەعیەو فیزەوە جلی لە زەوی دەخشا، خوای گەورە بەناخی زەویدا بردیە خوارەوە تاکو رۆژی دوایی.

٦١) ((مَنْ صَوَّرَ صورَةً كُلِّفَ يَوْمَ القِيامَةِ انْ يَنْفَخَ فيها الرُّوحُ ولَيْسَ بِنافِخٍ)) ٨/٢١٥.

هەرکەسێ وێنە بکێشێ لەرۆژی قیامەتدا زۆری لێ دەکرێ کەگیان بکا بە بەریدا، وەبۆشی ناکرێ دایبهێنێ.

٦٢) ((لَيْسَ مِنَ البِرِّ الصِّيامُ في السَّفَرِ عَلَيْكُمْ بِرُخْصَةِ اللهِ ﷻ فاقْبَلوها)) ٤/١٧٦.

لە چاکە دانیيە بەرۆژوو بوون لە سەفەردا چونکە بەرۆژوو نەبوون روخسەتێکی خودایەو لێی وەرگرن.

٦٣) ((لَعَنَ اللهُ المتَنَمِّصاتِ والموتشماتِ والمتَفَلِّجاتِ اللاتي يُغَيِّرْنَ خَلْقَ اللهِ ﷻ)) ٨/١٤٩.

## نەفرینی خوا لەو ئافرەتانەی دەموچاویان هەڵئەگرن

ئەوانەی خاڵ دەکوتن و ئەوانەش کە بە برینەو زیرە ددانی

خۆیان باریکەو تەنکەو شاش دەکەن بۆ جوانی ئەوانە وان ئەحتی و نیگاری خوا دەگۆڕن.

٦٤) ((لا یَحِلُّ لأحَدٍ انْ یَهَبَ هِبَةً ثُمَّ یَرْجِعُ فیها إلاّ مِنْ وَلَدِهِ)) ٦/٢٦٥.

دروست نییە بۆ هیچ کەسێ کە شتێکی بەخشی دوایی لێی پەشیمان بێتەوە تەنها لە کوڕی نەبێت باوکی دەتوانێت لێی بسەنێتەوە.

٦٥) ((لا تَرْجِعوا بَعدي كُفّاراً یَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقابَ بَعْضٍ لایؤْخَذُ الرَّجُلُ بِجنایةِ أبیهِ ولا جنایةَ أخیهِ)) ٧/١٢٧.

لەپاش مەرگی منا پاشگەز نەبنەوەو لەناو خۆتانا وەك کافران لە گەردنی یەکتری بدەن، وەکەسێ تۆڵەی لێ ناسێنرێتەوە لەسەر تاوانی باوکی یان براکەی.

٦٦) ((لایَزْني العَبْدُ حینَ یَزْني وَهو مؤمِنٌ ولا یَشْرِبُ الخَمْرَ حینَ یَشْرَبُها وَهوَ مؤمِن ولا یَسْرِقُ وَهوَ مؤمِن ولا یَقْتُلُ وَهوَ مؤمِنٌ)) ٨/٦٤.

کەسێ داوێن پیسی بکات، وە ئەوەی مەی بخواتەوە، وە ئەوەی دزی بکات، وە ئەوەی یەکێکی تر بکوژێ لەو ئان و ساتەدا هیچ ئیمان و بڕوایەکی لەناو دڵی نامێنێت.

٦٧) ((أول ما يحكم بين الناس في الدماء)) ٨٣/٧.

يەكەم شتێ کە خوای گەورە حوکمی لە نێوان خەڵکیدا دەکات لەسەر خوێن رشتنە لە رۆژی دوایی.

٦٨) ((إذا تواجه المسلمان بسيفيهما فقتل احدهما صاحبه فالقاتل والمقتول في النار قالوا يا رسول الله ﷺ هذا القاتل فما بال المقتول قال إنه اراد قتل صاحبه)) ٢٥/٧.

ئەگەر دوو موسڵمان گەیشتن بەیەکا بەچەکو یەکێکیان ئەوی تریانی کوشت ئەوا بکوژو کوژراوەکە دەچنە ناو ئاگری دۆزەخ جا هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بکوژەکەیە بەڵام کوژراو تاوانی چییە فەرمووی چونکە ئەویش ویستی وابوو ئەوی تر بکوژێ بەڵام ئەمیان دەستپێشخەری کردو کوشتنەکەی ئەنجام دا.

٦٩) ((أمرت أن اقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله فإذا قالوها منعوا مني دماءهم واموالهم إلاّ بحقها وحسابهم على الله ﷻ)) ٧٨/٧.

فەرمانم پێکراوە کە جەنگ لەگەڵ خەڵکان بکەم تاکو شایەتی دەدەن کە هەر خوا خودایەو هاوەڵی نییو ئەگەر ئەمەیان ووت ئیتر سەرو ماڵیانو گیانیان لە من قەدەغەن وە تەنها بەو حەقەی ئیسلام دای ناوە وەحیسابو لێ پرسینەوەیان

لەسەر خوایە.

٧٠) ((أيّما رَجُلٍ خَرَجَ يُفَرِّقُ بينَ أمتي فاضْرِبوا عُنُقَهُ)) ٩٢/٧.
هەر کەسێ ئەم ئوممەتی ئیسلامە پارچە پارچە بکاتو دووبەرەکی بخاتە نێوان موسڵمانان ئەوا لە گەردەنی بدەن.

٧١) ((عنْ جَرير بن عَبْدُالله قالَ بايَعْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ على إقامِ الصَّلاةِ وإيتاءِ الزكاةِ والنصحُ لكُلِّ مُسْلِمٍ وعلى فراقِ المشْرِكِ)) ١٤٨/٧.
جەریری کوڕی عەبدوڵلا دەفەرمووێ پەیمانم لەگەڵ پێغەمبەری خوا بەست لەسەر نوێژ کردنو زەکات دانو ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك بکەم وەدوور بکەومەوە لە شیرکو هاوەڵ دانان بۆ خوای بەرز.

٧٢) ((عنْ مَيمونَةَ انَّ النَّبيَّ ﷺ سئلَ عنْ فأرَةٍ وَقَعَتْ في سَمنٍ جامدٍ فقالَ خُذوها وما حَولَها فألْقَوهُ)) ١٧٨/٧.
مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی مشکێك کە کەوتە ناو رۆنەوە فەرمووی مشکەکەو ئەو رۆنەی چواردەوری فڕێ دەنو ئەوی تر خاوێنەو بیخۆن، بەڵام ئەگەر رۆنەکە شلەبوو ئەوا هەمووی پیسەو خاوێن نییە.

٧٣) ((كُلّ غُلامٍ رَهينٍ بعقيقَتِهِ تُذبَحُ عَنهُ يَومَ سابِعِهِ ويَحلَقُ راسَهُ ويُسَمّى)) ٧/١٦٦.

هەموو منالێك كەلە دایك دەبێ بارمتەی گوێزەبانەیەتی لەسەری کەڕۆژی حەوتەم ئاژەڵێکی بۆ سەرببڕن‌و سەری بتاشن‌و ناوی خۆشی لێ بنێن.

٧٤) ((لا يَخطُبُ احَدُكُمْ على خِطْبَةِ أخيهِ)) ٦/٧٣.

با کەستان خوازبێنی ئافرەتێ نەکات لەسەر خوازبێنی براکەی واتە تا ئەویان دەستی لێ هەڵدەگرێ ئینجا با ئەو مارەی بکات بۆ خۆی.

٧٥) ((فِراشٌ لِلرَّجُلِ وَفِراشٌ لأهلِهِ وثالِثٌ للضَّيفِ والرّابعُ للشيطانِ)) ٦/١٣٥.

پێخەفێك بۆ پیاو لە ماڵەوە ویەکێکی تر بۆ ئافرەتەکەی سێیەمیان بۆ میوانی‌و وەچوارەمیان بۆ شەیتانە، واتە لە سێ پێخەف زیاتر بێ بە زیادە رەوی حیسابە.

٧٦) ((عَنْ سَعدُ بنُ عبادة قالَ قُلْتُ يا رَسولُ اللهِ ﷺ إنْ أمّي ماتَتْ أفأتَصَدَّقُ عَنها؟ قالَ نَعَمْ، قُلتُ فَأيُّ الصَّدَقَةِ أفضَلْ قالَ سَقيُ الماءِ)) ٦/٢٥٤.

سەعدی کوڕی عوبادە دەفەرمووێ ووتم ئەی پێغەمبەری

خوا ﷻ ئیلیکم مردووەو ئایا دروستە خێرو صەدەقەی بۆ بکەم، ئەویش فەرمووی بەڵێ دەتم چ چاکەیەکی بۆبکەم گەورەترە لە هەموویان فەرمووی ئاوگێڕان بۆ خەڵکی.

٧٧) ((يَأتي على النّاسِ زَمانٌ لا يُبالي الرَّجُلُ مِنْ أينَ أصابَ مالَ مِنْ حَلالٍ أوْ حَرامٍ)) ٧/٢٤٣.

زەمانێ بەسەر خەڵکان دائێت کە پیاو ئەو ماڵەی کەکۆی دەکاتەوە گوێی پێ نادات چ بە حەڵاڵ چ بە حەرام بێت.

٧٨) ((إيّاكُمْ وَكَثْرَةَ الحَلْفِ في البَيْعِ فَإنّهُ يُنَفِّقُ ثُمَّ يَمْحَقُ)) ٧/٢٤٦.

لەسەرداو مامەڵەکردن دوور بن لە سوێند خواردن چونکە لە پێشدا برەو بە کاڵا دەدات لە پاشاندا پیتو بەرەکەت دەبا بەحەوادا.

٧٩) ((إنَّ المُقْسِطينَ عندَاللهِ تَعالى علىمنابِرِ منْ نور على يَمينِ الرَّحمنِ الّذينَ يَعْدِلونَ في حُكْمِهِمْ وأهْلِيهِمْ وما وَلّوا)) ٨/٢٢١.

دادپەروەران لە رۆژی دوایی لە نزیکی خوادان، وان لەسەر مەشخەڵی نور، ئەو کەسانەن کە بەحەق و عەدالەت حوکم لە نێوان خۆیان و خەڵکی و ژێر دەستەی خۆیان دەکەن.

٨٠) ((تَصَدَّقوا فَإنّهُ سَيَأتي عَلَيْكُمْ زَمانٌ يَمْشي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ

فَيَقُولُ الَّذي يُعْطاها لَـوْ جِئْـتَ بِـالأَمْسِ قَبِلْتُها فَامَّـا الـيَومْ فَـلا)) ٧٧/٥.

ماڵ ببەخشن چونکـە زەمانـێ بەسـەرتان دا دێت کـەپیاوێ زەکاتی مـاڵی خـۆی دەدات بـە هـەژارێکو ئـەویش دەڵـێ ئـەمڕۆ پێویستیم پێی نییە بەڵام ئەگەر دوێنێ هاتبای وەم دەگرت.

٨١) ((عَنْ عائِشَةَ قالَتْ كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَقولُ اللَّـهُمَّ إنّـي اعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مالَمْ اعْلَم)) ٢٨١/٨.

عائیشە خان دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو لە پاڕانەوەیدا خوایە پـەنا دەگـرم بـە تـۆ لەشـەڕی ئـەوەی کـە لەرابوردوودا کردوومەو لەشەڕی ئەوەی کە نایزانم.

٨٢) ((عَنْ أنَس بنِ مالِكٍ ﷺ انَّ رَسولُ اللهِ ﷺ كانَ إذا دَعا قالَ اللَّهُمَّ إنّي اعوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ والحُزنِ والعَجزِ والكَسَلِ والبُخلِ والجُبْنِ وَضَلعِ الدَّينِ وَغَلَبَةِ الرِّجالِ)) ٢٥٨/٨.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرمووێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەپاڕاوە دەیفەرموو خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە غـەمو خەفـەتو ترسو کۆڵەواریو دەسەوسانو بێکاریو تەمبـەڵیو تـەوەزەلیو رەزیلیو ترسنۆکی وکەڵەکە بوونی قـەرزو قۆڵـە بـوونو کەوتنـە ژێر باری قەرزو زاڵ بوونی دوژمنان.

٨٣) ((ابغوني الضعيف فإنكم إنما ترزقون وتنصرون بضُعَفائِكُمْ)) ٦/٤٦.

ئاگاتان لە بێنەوایانو هەژاران بێتو چونکە ئێوە رزقو رۆزیتانو سەرکەوتنتان بەهۆی دوعای بێ نەوایانەوە دەبێت بۆتان.

٨٤) ((مَنْ نَذَرَ أنْ يُطيعَ اللهَ فَلْيُطِعْهُ وَمَنْ نَذَرَ أنْ يَعصي اللهَ فلا يَعصي)) ٧/١٧.

کەسێ نەزری کرد گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بێت با نەزرەکەی بباتە سەر، بەلام ئەگەر نەزری کرد بێ فەرمانی خوا بکات با بێ فەرمانی خوا نەکات.

٨٥) ((إنَّ العُمْرى جائِزَةٌ)) ٦/٢٧٢.

عومرا لە شەرعدا جائیزەو دروستە.

عومرا: بریتی‌یە لەوەی کەیەکێك ماڵێك بدات بە یەکێکی ترو بلێ ئەم ماڵەم دابەتۆ تا ماویت کە مردیت لە پێش من دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆم..

٨٥) ((عَنْ عَمرو بنُ قَتادة وكانَ مِنْ أصحابِ النَبيّ ﷺ أنْ رَجُلاً قالَ يارَسولُ اللهِ مَن الكَبائِرِ؟ قالَ هنَّ سَبْعٌ أعْظَمهنُ إشراكٌ باللهِ وَقَتلُ النَفسِ بِغَيرِ حَقٍّ وَفِرارُ يَوْمِ الزَحفِ)) ٧/٨٨.

عەمری کوڕی قەتادە کە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ خوا ﷺ دەفەرمووێ: پیاوێ لە پێغەمبەری خوای پرسی: گوناهە گەورەکان چین؟ ئەویش فەرمووی حەوتن بەڵام گەورەترینیان هاوەڵو هاوبەش پەیدا کردنە بۆ خوا، وە کوشتنی کەسێ کە خوا ڕەوای نەدابێو هەڵاتنو پشت کردن لە مەیدانی[2] شەڕدا.

٨٧) ((إنَّ مِنْ اشراطُ السّاعَةِ أنْ يَفْشوا المالَ وَيَكْثُر وَتَفشوا التِجارةَ وَيَظْهَرَ العِلْمَ وَيَبيعَ الرَّجُلَ البَيْعَ فَيَقولُ لاَ حتّى اسْتَاجِر تاجرْ بني فُلان وَيَلْتَمِس في الحيّ العَظيمِ الكاتِبَ فلا يوجَد)) ٧/٢٤٤.

لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ماڵو سامان زۆر دەبێو بڵاودەبێتەوە لە نێوان خەڵکیدا وەبازرگانی زۆر دەبێو عیلمو زانست زۆر دەبێت وە کڕینو فرۆشتن زۆر دەبێت وا دەبێت یەکێك نابیننەوە کە بڕوای پێ بکەن بۆیان بنووسێو دەڵێت با بچین بۆ لای فلانە کەس کەلە فلانە تیرەیە ئەویش نابیننەوە بۆیان بنوسێ کە ئەمینو دەست پاك بێت.

٨٨) ((مَنْ اخَذَ دَيْناً وَهوَ يُريدُ أنْ يُؤدِّيَهُ أعانَهُ اللهُ ﷻ)) ٧/٣١٦.

کەسێ قەرزی وەرگرتو نیەتی دانەوەی هەبوو خوای

گەورەش پارمەتی دەدات بۆ دلنەوەی قەرزەکەیو بۆی ئاسان دەکات.

٨٩) ((أيما إمرأة زادت في رأسها شعراً ليس منه فإنه زور تزيد فيه)) ١٤٥/٨.

هەر ئافرەتێ پرچی دەستکردی لەسەری خۆی قایم کردو لەسەری خۆی زیاد کرد ئەوا درۆو بوختانی زیادی کردووە (واتە دروست نییە پرچی دەستکرد لەسەری خۆی دابنێ).

٩٠) ((لَعَنَ اللهُ مَنْ لَعَنَ والِدَهُ وَلَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ وَلَعَنَ اللهُ مَنْ آوى مُحْدِثاً، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ غَيَّرَ مَنارَ الأَرْضِ)) ٢٣٢/٧.

نەفرینی خوا لەوەی نەفرینی لە دایکو باوکی خۆی دەکات، وە لەوەی قوربانیو سەربڕین بۆ جگە لە خوا ونەفرینی خوا لەوەی شتێ لە دین زیاد دەکاو لەوەش کە سنووری زەوی خەلکی دەبەزێنێ بۆ خۆی کلی دەداتەوە.

٩١) ((مَنْ قاتَلَ تحْتَ رايَةٍ عِمِّيَّةٍ يُقاتِلُ عَصَبِيَّةً وَيَغْضِبُ لِعَصَبِيَّةٍ فَقِتْلَتُهُ جاهِلِيَّة)) ١٣٢/٧.

کەسێ شەڕ بکات لەژێر ئالای کوێرەوەرییو نەزانی وشەڕ بکات لەسەر دەمارگیری تووڕە بێت لەسەر دەمارگیرییو خوا نەناسیو گوناهو تاوان ئەوا مردنیشی بە نەزانییە.

هەرکەسێ جلو بەرگی لەخوار گوزینگەوە بێت و بیخشێنێ لە زەویدا بۆ دەعیەو فیزەوە ئەوا ئاگری دۆزەخ بۆی باشە.

٩٣) ((عنْ عائشةَ أنَّ رَسولُ اللهِ ﷺ كانَ إذا أمطَرَ قالَ اللّـهُمَّ اجْعَلْهُ صَيّباً نافِعاً)) ١٦٤/٢.

عائیشە دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا ﷺ کە باران دەباری دەیفەرموو: خوایە گیان ئەم بارانە بیکەی بە مایەی سوودو قازانجو هەرزانی بۆ ئێمە.

٩٤) ((يُوشِكُ أنْ يَكونَ خَيْرُ مالِ مُسْلِمٍ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهاَ شَعَفَ الجبالِ وَمواقِعَ القِطَرِ يَفِرُّ بِدينِهِ مِنَ الفِتَن)) ١٢٤/٨.

نزیکە چاکترین مالی موسڵمان خوا پێی دابێت مەڕ بێت و لەگەڵیا بچێتە لاپاڵی چیاوەکەو شوێنی باران بارین وە رادەکات بۆ پاراستنی دینەکەی لە فیتنەو ئاشووبو پاشگەز بوونەوە.

٩٥) ((مَثَلُ المُنافِقِ كَمَثَلِ الشاةِ العائِرَةِ بَيْنَ الغَنَمينِ تعيرُ في هذه مَرّةً وفي هذه المرّة لا تدري أيها تتبع)) ١٢٤/٨.

نموونەی پیاوی موناڧیق وەکو ئەو مەڕەی سەرلێشێواو وایە کە نازانێ لەگەڵ کام مێگەل دایە هەر جارێ بەلای مێگەلێ رادەکات و دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی.

٩٦) ((إنَّ الصَّدَقَة علـى المِسْكينِ صَدَقَـةٌ وعلى ذي الرَّحِـمِ إثنتانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ)) ٥/٩٧.

خێر كردن بە هەژاران هەر خێرێكەو بەس بەڵام خێر كردن بە خزمی هەژار دووجار خێرە، یەكیان خێری ئاسایی‌یەو ئەوی تریش خێری بەسەركردنەوەی خزم‌و خوێشە.

٩٧) ((لاَ تُنْكِحُ المَرأةُ على عمَّتِها ولاَ على خالَتِها)) ٦/٩٧.

ژن مارە ناكرێت بەسەر پووری میمكی، واتە كچێك‌و پووری كچە یان میمی كچە لەژێر یەك مارەكردندا كۆ نابنەوە واتە (دروست نی‌یە).

٩٨) ((عَنْ إبنِ عُمَرَ أنَّ رَسولُ اللهِ ﷺ نَهى عَنِ الشِّغار والشِّغارُ أنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ إبْنَتَهُ على أنْ يُزَوِجَهُ إبْنَتَهُ وَلَيسَ بَيْنَهُما صُداقٌ)) ٦/١١٢.

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر دەفەرمووێ پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لەژن بە ژنی، ژن بە ژنی ئەوەیە كە دووپیاو كچی خۆیان بدەن بە یەكتری بیگۆڕنەوە بەبێ دانانی مارەیی دیاری كراو لە نێوانیاندا.

٩٩) ((الصَّعيدُ الطَّيبُ وَضوءُ المُسْلِمِ وإنْ لَمْ يَجِدِ الماءَ عَشْرُ سِنينَ)) ١/١٧١.

خۆڵی پاك دەستنوێژی موسڵمانە با تاکو دەساڵیش ئاوی دەست نەکەوێ تەیەمموم دەکات بەڵام هەرکاتێك ئاوی دەستکەوت تەیەممم بەتاڵە.

١٠٠) ((عَنْ إبنِ عُمَرَ قَالَ سَألَ رَجلٌ رَسولَ اللهِ عَنْ صَلاةِ اللّيلِ؟ فَقالَ مثنىَ مثنىَ فَإذا خشيتَ الصُّبحَ فَواحِدةٌ)) ٢/٢٢٣.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەفەرموێ: پیاوێك لە پێغەمبەری خوای پرسی ﷺ دەربارەی شەونوێژ ئەویش فەرمووی شەونوێژ دوو ڕەکعات دوو ڕەکعاتە بەڵام ئەگەر ترسی هاتنی نوێژی بەیانیت بوو بیکە بە وەتر واتە (تاك).

کۆتایی هات بە فەزڵی خوای گەورە
چاوەڕوانی زنجیرەی تر بن

سوپاس پێزانین / لە پاش سوپاسی خوا زۆر سوپاسی بەڕێز عەبدوڵڵا حەمە سواد دەکەین بۆ یارمەتی پاکنووس کردنی ئەم نامیلکەیە بە خەتی جوانەکەی خوا ئەجرەی زۆر بکات

آمین

تەواوبوو ١٩٩٩/٦/١٧

